# باڵیسان

## تۆماری مێژووی بیست ساڵەی بوون بە ناحیە

## ١٩٩٨- ٢٠١٨

ئامادەکردنی / مخلص اسماعیل ابراهیم

دیزاین / محسن صالح بالیسانی

چاپ/ یەکەم

چاپخانە / ماردین

ساڵی چاپ / ٢٠١٩

تیراژ/ ٢٥٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٣٧٧) ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە.

## چەند زانیاریەکی پێویستی سەرەتایی لە پێش پێشەکیەوە.

### وشەی بالیسان لە چیەوە هاتوە؟ بەم شێوەیە ڕاڤەکراوە.

- ماموٚستا ئەحمدی قاجانی لە کتێبی خوٚی بەناوی (شعلة في درب التأريخ) دا دەڵێت، بالیسان وشەیەکی (سریانیە) و بە واتای نزارو قەد پاڵ دێت.
- ماموٚستا (مەحمودی حەمامیان) لە کتێبی خوٚی بەناوی (ستارەی تابان) بە فارسی نوسراوە دەڵێت بالیسان بەزمانی ئارامی واتا (هێلانە).

ماموٚستا مەلا (فتح الله)هەرتەلی لە کتێبی خوٚی (مبحث عن منطقة بيتواتة) هوٚی ناونانی دەگەڕێنێتەوە بوٚ هاتنی هەندێ لە گوٚتیەکانی نزیك دەریای قەزوین و مانەوەیان لێرە ئەو دەشتەی کە لێوەی هاتون ناوی بالیسان بوە، هەمان ناویان لێناوە بە زمانی مادد واتا (مێرگ) دەڵێ پێش هاتنیان ناوی ئەردەهان بوە.

- تەها باقر لە کتێبی خوٚی (الاماکی) دەڵێت بالیسان بە زمانی عیبرانی واتا (بەروٚچکە).
- ماموٚستا (ئەنوەر مائی) دەڵێت وشەی بالیسان بە زمانی قەدمونی (میبطر) ی واتا (پیروٚز)، کاتی خوٚی بەر لە مێژوی زاین کوٚمەڵە قەدمونیەك پەرستگەیەکیان دروست کردوە ناویان ناوە بالیسان واتا (پیروٚز). ماموٚستا حوزنی موکریانی و شەریفی حەیدەری و مەلا سەلامی حەیدەری پشتگیری ئەم ڕایەیان کردوە. بوٚ مێژو ئەم زانیاریانەم وەرگرت لە کوٚچکردو (مەلا خالید حسێن حەسەن) ناسراو بە مەلا خالید چاوشین لە ٢٦ / ٥ / ٢٠٠٢ بە داخەوە بەڕوداوی ئوٚتوٚمبێل کوٚچی دوای کرد، ئەو لە مەلا سەلامی حەیدەری کوٚچکردوی وەرگرتبو منیش پاراستم. تا ئێستا ئەوەندەی بە دواداچونم کردوە ئەو سەرچاوانەم بەردەست نەکەوتون هیوام وایە خەڵکی شارەزا لە ئایندەدا لێکوٚڵینەوەی تەواو بکەن و ساغی بکەنەوە.

- وتراوە ناوی بالیسان کوردیەو بەم شێوەیە لێکدراوەتەوەو ماناکراوە.
- (با) بە ئاشکرا ماناکەی دیارە.

(لیس) بەم شوێنە دەوترێت کە با نەگرێتەوە، ئەوانەی دەچن بۆ ڕاو لە شوێنی لیس دەگەڕێن بە تایبەتی بۆ ڕاوی (کەو) چونکە شەوان کەو لیسی تایبەتی خۆی هەیە. سەرەتای دروست بونی بالیسان دەکەوێتە پشت کانی گەورە کە زۆر لیسە با کەم دەگرێتەوە. وتویانە بای لیس نیە لەگۆکردندا بوە بە بالیسان. وەکو شەقلاوە وتراوە سەرەتا شەقل و ئاو بوە یان ئاو شوێنەکەی شەق کردوە وتویانە شەق ئاوە دواتر بوە بە شەقراوە بە زاراوەی خۆشناوەتی، لە نوسین دا بوە بە شەقلاوە. ئەم ڕایە لاوازەو پشتگیری نەکراوە.






## ناوی گوندەکانی لە چیەوە هاتوە ؟

**خەتێ / بەهۆی ناکۆکی لەسەردەسەلاَت لە نێوان میرنشینەکان لە کۆن دا وەك(خەت) واتا هێڵی سنور نیشان کراوە لە نێوان خۆشناو و هەروتی، ئەمە لەسەر زاری دانیشتوان.**

**بێڕۆ / هۆی ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵکەوتەی جوگرافیای ئەم گوندە کە هیچ ڕوی تەخت و ڕاستی نیە واتا (بێ ڕوە). هەندێکیش دەڵێن لە (پێ ڕۆ) هاتوە بەمانا ئاژەڵداری هەبوە.**

**توتمە / تا ئێستا مانای نەزانراوە وتراوە وشەیەکی (ئەخمینی) یە بەلاَم ماناکەی نازانرێت.**

**باروکاوە / دەوترێت لە (بلاروکاوە) وە هاتوە بەهۆی بونی دار بلاروك لێی لە کۆندا.**

**دەراش / دەراو و ئاشی هەبوە لە کۆن دا، ناوی (دەراش)ی بەبەردا بڕاوە.**

**کانی بەرد / ئەو ئاوەی بۆتە سەرچاوە بۆ دانیشتوانەکەی لە ناو بەردێك هاتۆتە دەرەوە و وتراوە (کانی بەرد).**

**شێخ وەسان / لەدەم خەڵکەوە دەڵێن لە ناوی شێخ وەسمان ناوێك ئەم ناوەی بۆ داتاشراوە، هەندێك دەڵێن لە (شێخ وەستان) هاتوە واتا ئەم شێخانەی لەوێ ژیاون وەستا بون ئنجا لەقسە یان لە پیشەدا.**

**بێراوە / لە ئاژەڵ داری بەخێوکردنی مەڕو بزن دا شوێنی تایبەت هەیە بۆ (بێری) کردن واتا دۆشین، وتراوە بێریاوە دواتر بوە بە بێراوە، کانی (بێریان)ی بەڵگەیە بۆ ئەم ناوە.**

**خۆران / بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی ئەم شوێنە هەموی گڵەو بەردی نیە، بە زاراوەی خۆشناوەتی واتا هەموی (خۆرە) و بەردی نیە وتراوە(خۆران).**

**شیرە / مێژوی ئەم گوندە زۆر نیە و دانیشتوانی ئەڵێن بەشێك بوە لە بێراوە ناوەکەشی لە ئاوە شیر هاتوە، کە دەکەوێتە سەروی گوندەوەو سەرچاوەی ئاوی دانیشتوانیەتی، شیرەی سەرو شیرەی خوارو لەمەوە هاتوە.**

**سپیلکە / مێژوی زۆر دورنیەو ناوەکەی لە ئاوی کانی سپیلکە هاتوە.**

**تێبینی / دەکرێت خەڵکی شارەزا بچنە بنج و بناوانی هەریەکێك لەم ناوانەو زیاتر ساغی بکەنەوە.**



شیرەی سەروو - ٢٠١٨



شیرەی خواروو - ٢٠١٨



بێراوە - ٢٠١٨

* **کارەسات و سوتان.**

- **بۆ کۆتایی هێنان بە حوکمی میرنشینە کوردیەکان سوپای عوسمانی (تورک)هاتۆتە باشوری کوردستان و تا توانیویەتی زوڵم و ستەمی کردوە، کاتی گەیشتونەتە سنوری بالیسانیش کارەساتی گەورەیان ئەنجامداوە. دەگێڕنەوە کە سوپای تورك چاڵی گەنمیان دەدۆزیەوەو ئاگریان دەدا و(هەمبان)ی دانەوێڵەیان لەگەڵ خۆڵ تێکەڵ دەکردو پەلەوەڕیان سەردەبڕی. تالآنی بێشوماریان کردوە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی لە برسان بمرن و نەمێنن. بەسالأچوان دەڵێن گەر تورك هات نانی سەر سێر بەجێبێڵە، ئەمە بە لگەیە بۆ دڕندەیی سوپای عوسمانی.**
- **سوپای ڕوس لە جەنگی جیهانی یەکەم هاتۆتە کوردستان و بێرەدا گوزەری کردوەو نەهامەتی زۆری بۆ دانیشتوانەکەی هەبوە.**
- **سوپای ئینگلیز لە ساڵی ١٩١٨ هاتۆتە ناوموسڵ، بەدوایدا هاتۆتە هەولێرو هەڵکشاوە تا ئەم دەڤەرە، ئاگاداری ئاغاو بەگ و دەسەلأتدارو سەرداری هەر گوندێك دەکات، هەرکەس خۆی بداتە پاڵ چیای هەوریٚ ئەوە بە تەسلیم بون دادەنرێت و خۆی و گوندەکەی پارێزراو دەبن، بە پێچەوانەوە هەرکەس خۆی ڕادەست نەکات گوندەکەی دەسوتێنرێت. ئەو کات ئاغای بالیسان (عەزیز بەگ) بوە، ڕای کردوە و ئامادەنەبوە تەسلیم بێت بۆیە سوتێنراوە. سوپای ئینگلیز لە نزیك گردی دێگە بە دیاری کراوی لەو شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن (ڕێزە توو) هەڵیداوە.**
- **لەسەر دەستی حکومەتی ناوەندی بەغدا لە ساڵی ١٩٦٣ سوتێنراوە. دانیشتوانەکەی ئاوارە بون.**
- **ساڵی ١٩٧٤- ١٩٧٥ بە هۆی زۆری بۆردومانی تۆپ و فڕۆکە جەنگیەکانی سوپای عیراق ژیان تیایدا زۆر ئەستەم بوە و نزیك بوە لە چۆڵ بون، چەکی ناپاڵم و فسفۆریشی تیادا بەکارهاتوە.**
- **لە ١٦ / ٤ / ١٩٨٧ لەلایەن فڕۆکە بۆمب هاوێژەکانی حکومەتی دیکتاتۆری لە ناوچوی بەعس بۆ یەکەم جار لە کوردستان دانیشتوانی سقیلی شێخ وەسان وبالیسان و دەورو بەری بەخەستی کیمیاوی باران دەکرێن. دەبێتە هۆی شەهیدو بریندار بونی ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ و ژن و پیرو گەنج وپیاوی سنورەکە و**

ژینگەی ناوچەکە ژەهراوی دەبێت. لەبەرئەم هۆیە بو پەرلەمانی کوردستان ڕۆژی ٦/١١ / ٢٠٠٨ بە یاسای ژمارە(٨)ی ساڵی ٢٠٠٨ بەرواری ١٦ / ٤ هەمو ساڵێکی بە ڕۆژی ژینگەی کوردستان ناساند. دوبارە لـە (١٩٨٨/٧/٣١) لەگەڵ گوندی خەتێ کیمیاباران کراوەتەوە و بۆتە هۆی شەهیدو بریندار بونی چەندان کەس، بۆ کۆتایی ١٩٨٨ هەمو سنورەکە سوتماك کراوە و بوەتە ناوچەی قەدەغە کراو (محرمة). دانیشتوانەکەی بەشێکی زۆر کەمی ڕوی لە ئێران کردو ئەوەی تری لە ئۆردوگا زۆرەملێکان نیشتەجێ بون و هەندێکیشیان چون بۆ شارەکانی تری کوردستان.

- سەرنج / دۆخەکە بەم شێوەیە ماوەتەوە تاکو ڕاپەرینە مەزنەکەی ٥ / ٣ / ١٩٩١ هەرلەو ساڵەدا وردە وردە دانیشتوانی سنورەکە هاتنەوەو خانویان دروست کردنەوەو دەستیان بە ژیان کردەوە.
- تێبینی / لە مێژودا لەسەر زاری دانیشتوانەکەی ١- لەگرانی گەورەدا خەڵکی زۆر لە ناوچون، بەهۆکاری زۆر وەك نەبونی و برسێتی و نەخۆشی جۆراو جۆر.٢- ئاوی کانیێ گەورە وشکی کردوە دانیشتوانی باریان کردوە بۆ شوێنەکانی تری دەورو بەری بەڵام ماوەکەی زۆر نەبوە دواتر گەڕاونەتەوە. ٣- سن و کیسەڵەو کلۆ داویەتی لە بەروبومەکان بەتایبەتی گەنم و جۆ.٤- بەفری ئەستور باریوە نمونە ساڵی ١٩٩٢ زیاتر لەیەك مەترو سی سانتیم ناو دێکان و نزیکی دوو مەتر لە چیاکانی باریوە.



بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان



پێشەکی :

مێژوناسان ولێکۆڵەرەوان و شارەزایانی بوارە جیاوازەکانی تری کۆمەڵگە، ڕەخنەی زۆریان هەیەگەلەکەمان کەمتەرخەمە لە نوسین و تۆمارو ئامار ئەمەش ڕاستە. بێگومان ئەم بوارە گرنگە لە ئێستاو لە ئایندەدا، سودی باشی هەیە بۆ زۆر بابەت و توێژی جیاواز. لەم چەند لاپەڕەیە دوای ئەوەی بالیسان بوە بە ناحیەو سنوری ئیداری بۆ دیاری کراوە، ئەوەی خراوەتە ڕو لە نوسین و تۆمارو ئامار بەندە پێی هەڵساوە. بێگومان بێ کەم و کوڕی نابێ بە تایبەتی بۆ من کە شارەزایەکی ئەو تۆم نیە لەم ڕوەوە. بەهەرحاڵ بە باشم زانی ئەوەندە هەبێت نەك هەر هیچ نەبێت. سوپاسگوزاری هەمو ئەو کەسانە ئەکەم کە بە بچوکترین شێوەش بێت هاوکاریان کردوم.ئەوەندەی ئاگاداربم تا ئێستا هیچ کەسێك هەڵنەستاوە بە کارێکی لەم شێوەیە٠ هیوام وایە خزمەتێکی بچوکم کردبێت.

مخلص اسماعیل ابراهیم

٢٤ / ٧ / ٢٠١٨

## دروست بونی ناحیەی بالیسان

**گەلێك میللەت توشی شەڕی ناوەخۆ بون، کورد دوای ڕاپەڕینی ٥ / ٣ / ١٩٩١ پاش کیمیاوی باران و کوشتنی بەکۆمەڵ و وێرانبونی زیاتر لە ٤٠٠٠ هەزار گوندو شاربە دەستی حیزبی بەعسی لەناوچو، ئەوەی نابو بە بیری هیچ کەسدا هاتبا شەڕی ناوەخۆ بو، بەس داخی گرانم ڕویدا، شەڕی ناوەخۆ ماڵوێرانی و کارەساتی زۆری لێکەوتەوە، ئەوەی لە هەمویان جەرگبڕتر دابەشبونی باشوری کوردستان بو بۆ دوو خۆبەڕێوەبردن (دووئیدارەیی) و بەهەزاران ڕۆڵەی ئازیزی کورد بونە قوربانیی شەڕی خۆکوژی، بەرواری ٣٠ / ١٠ / ١٩٩٨ ساڵیادی یەکەمی یەکێك لە قوربانیەکان (نەجیم ئەحمەد حوسێن) ناسراو بە مەلا نەجم بوو، کە ڕۆڵەیەکی تێکۆشەرو جوامێرو ئازاو لەخۆبوردوی کەم وێنەبوو. بەڕێز (کۆسرەت رەسول علی) سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی ئەوکات (ئیدارەی سلێمانی) مژدەی بون بە ناحیەی بە دانیشتوان دا، وە هەر لەو رۆژەدا کارەبای نیشتمانی هەڵکرد، کە پێش چەند ڕۆژێك بە کاری بە کۆمەڵ و بە دەستی دانیشتوانی سنوری ئێستای ناحیەی بالیسان کارەبا گەینرابوە کانی (باراوی)ی بالیسان ودواتر بۆ گوندەکانی تریش بردرا. فەرمانی بون بەناحیە بەفەرمی لە ٢٨ / ١٢ / ١٩٩٨ دەرچو، بەڕێز صالح ئەکرەم حەیدەری وەك یەکەم بەڕێوەبەری نەحیە لە ١٥ / ٤ / ١٩٩٩ دەست بەکاربو. سنوری ئیداری و جوگرافی ئەم گوندانە لە خۆ دەگرێت، (گوندی خەتێ- گوندی بێرۆ- گوندی سپیلکە - گوندی باروکاوە - گوندی توتمە - گوندی دەراش - گوندی کانی بەرد - گوندی شێخ وەسان - گوندی بێراوە - گوندی خۆران - گوندی شیرەی خواروو- گوندی شیرەی سەروو)٠بالیسان لە ڕوی کارگێڕیەوە سەر بە قەزای شەقلاوە - پارێزگای هەولێرە بە دوری (٣٠) کم دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی شەقلاوە.**

# تۆماری دروست بونی داو و دەزگا حکومیەکان وخزمەتگوزاریەکان.

| دەزگای حکومی + خزمەتگوزاری. | بەروار | تێبینی |
|---|---|---|
| کارەبا | ٣٠ / ١٠ / ١٩٩٨ | سعید توتمەیی + یاسین بالیسانی + عبداللە شێخ وەسانی لێژنەی سەرپەرشتی و کۆکردنەوەی هاوکاری بون بۆ هێنانی کارەبا. |
| فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران بۆ بون بەناحیە. | ٢٨ / ١٢ / ١٩٩٨ | |
| یەکەم بەڕێوەبەری ناحیە دەست بەکاربو. | ١٥ / ٤ / ١٩٩٩ | صالح اکرم اسماعیل حەیدەری بوبە بەڕێوەبەری ناحیە زیاتر لە ١٥ساڵ خزمەتی زۆری کرد. |
| بنکەی ئاسایشی بالیسان. | ١٩٩٩ | محمد حسین (هاورێ کاوە)بو بە ل. بنکە. |
| بنکەی پۆلیسی بالیسان. | ١٩٩٩ | ملازم خدر ل. بنکە بو. |
| دارایی | ١٩٩٩ | مەهدی مستەفا حمدامین بو بە لێپرسراو. |
| یەکەم ئەنجومەنی بالا هەڵبژێردرا. | ١٠ /٧ / ١٩٩٩ | محمد طه (خەتێ) قادر طه(توتمە) صابر مستەفا (شێخ وەسان) جلال طه(بالیسان) حاجی تۆفیق(شیرە). |
| سەرۆکایەتی شارەوانی بالیسان. | ٣ /٢ / ٢٠٠٠ | بۆیەکەم جار هەڵبژاردن لە کوردستان کرا بۆسەرۆك و ئەنجومەن(جمال رسول حاجی)بە سەرۆکی شارەوانی هەڵبژێردرا.ئەنجومەنەکانیش (حسن رسول - محمد رسول - محمد شێخە - زیاد باوکر).دوای چەند مانگێك م. جمال دەستی لەکار کێشاوەو حسن رسول حسن بو بە سەرۆکی شارەوانی. |
| کردنەوەی یەکەم خوێندنگەی ناوەندی. | ٢٠٠٠ | مامۆستا / عبدالقادر محمد خدر بەڕێوەبەربو.زۆربەی وانەکانی دەوتنەوەو دڵسۆزانە خزمەتی کرد.شایانی رێزە. |
| بینایەی ئاژەڵداری (بەیتەریە) | ٢٥ / ١ / ٢٠٠١ | |
| دروست کردنی کۆمەڵگەی فەرمانگەکان (مجمع دوائر) + سێ خانو بۆ لێپرسراوانی حکومی. | ٢٠٠٢ | |
| بینایەی بەشی ناوەخۆی خوێندکاران | ٢٠٠٣ | مامۆستایان و خوێندکارانی شوێن دور نیشتەجێ بون تیادا. |
| بنکەی پۆلیسی فریاکەوتنی بالیسان | ٣ / ١١ / ٢٠٠٣ | رائد /طالب مصطفی بو بە لێپرسراو. |
| بنکەی پۆلیسی دارستانی بالیسان | ١ / ٢ / ٢٠٠٤ | سەلام حەیدەر وەیس بو بە لێپرسراو. |
| بنکەی پۆلیسی بەرگری شارستانی بالیسان | ٨ / ٨ / ٢٠٠٤ | فرسەت مصطفیصابر بو بە لێپرسراو. |
| کۆمسیۆنی هەڵبژاردنەکانی عێراق | ٢٠٠٥ | ئۆفیسی لە ناو بینایەی ناحیە بو. |

| | | |
|---|---|---|
| دابەش كردنی زەوی بەسەر فەرمانبەارن و بێجێ و ڕێیەکان لە لایەن شارەوانی باليسان | ١٦ / ٦ / ٢٠٠٥ | ٣١١ پارچە زەوی بو بەشەكيان درانەوە خاوەن زەویەکان وەك قەرەبوبۆيان. |
| نەخۆشخانەی گشتی شەهيد شێخ سلێمان / باليسان. | ٢٩ / ١٠ / ٢٠٠٥ | لەلايەن وەزيری تەندروستی كراوە د. گێلاس محمد كرابە بەڕێوەبەر. |
| دانانی بورجی تۆڕی پەیوەندی (سانا) دواتر بو بە كۆڕەك تيليكۆم. | ٢٠٠٥ | پێش دانانی بورجەكە بە دەگمەن تۆڕی پەیوەندی (شبكة)لە هەندێ شوێن هەبو. |
| بینایەی هۆبەی كشتوكاڵی باليسان | ٢٠٠٥ | پیشتر لق بو كرا بە هۆبە، عبدالله عباس لێپرسراوی هۆبە بو پێشتر لقێك لە ١٩٩٨ كرابووەوە حسن سيدا رواندزی ل. بو. |
| تەلەفۆنی نۆرماڵ | ٢٥ /١ / ٢٠٠٦ | ١٥ هێڵ بون. |
| هۆڵی بۆنەكان | ٢٦ / ٢ / ٢٠٠٦ | تەواو كرا. |
| ٢٢ دووكانی شارەوانی لە سەر شەقامی گشتی باليسان | ٨/ ٨ / ٢٠٠٦ | تەواو كران ژمارەيان ٢٢ دوكان بو. |
| باڵەخانەی پزيشكان | ٨ / ٧ / ٢٠٠٦ | نزيك نەخۆشخانەی گشتی. سێنهۆمە |
| مزگەوتی شێخ محی الدين | ٢٠٠٦ | نزيك بینایەی ناحیە. دروست كردن / خێرخوازی. |
| پاركی (هەڤاڵ مام جەلال) | ٢٠/ ٥ /٢٠٠٧ | نزيك گۆڕستانی بادينار. |
| قیرتاوكردنی ڕێگای زینەتیر | ١٢ / ٦ / ٢٠٠٧ | دەست پێكرا بە چەند مانگێك تەواوبو. |
| فەرمانگەی باری شارستانی باليسان (نفوس) | ٢٢ / ٧ / ٢٠٠٧ | ئومێد خاليد حسێن بو بە لێپرسراو. |
| خوێندنگەی ئامادەيی تێكەڵاو / باليسان | ٩ / ١٠ / ٢٠٠٧ | م/ عبدالقادر محمد بەڕێوەبەربو. |
| خوێندنگەی بنەڕەتی شەهيد عبدالخالق /باليسانی تێكەڵاو | ١٧ / ٩ / ٢٠٠٧ | م. صلاح حسين عيسى بەڕێوەبەر بو. پۆلەكانی ٧ + ٨ + ٩ی بۆ جياكرانەوە لە ئامادەيی. |
| چەو ڕێژكردنی كۆڵانەكانی باليسانی نوێ. | ٢٨ / ٤ / ٢٠٠٨ | |
| لێدانی بيری ئيرتيوازی | ١٤ / ٥ / ٢٠٠٨ | دوو بير لە بن زينەتير يەك لە گەری ئەشكەوت. ئيستا لە بن زين ٥ بير هەن يەك لەكاركەوتوە. |
| دانانی چەند كورسی ومێزو كەپرو ياری منداڵان بۆ گەشت و سەيران | ١٧ / ١٢ / ٢٠٠٨ | لە نزيك گوندی دەراش. |
| تۆڕی كارەبای باليسان + شێخ وەسان. | ٣٠ / ٩ / ٢٠٠٩ | نۆژەن كراوە بە شيوەی نوێو ئەندازياری. |
| كۆنكرێت كردنی جۆگاكانی ئاودێری ناو | ١٠ / ١٠ / ٢٠٠٩ | قۆناغی يەكەم لە ١٩٩٨ نزيكەی ٥٠٠ مەتر |

| | | |
|---|---|---|
| گوندی بالیسان. ١٦٠٠ مەتر | | جۆگای ناو گوند هەردوو بەری رۆژهەلأت و رۆژاوای کانی گەورە جێ بەجێ کرا بو. |
| قیرتاوکردنی ڕێگای شرێمك | ١٥ / ١٠ / ٢٠٠٩ | نزیکەی ٢ کم ە. |
| یاریگای چیمەنی دەستکرد | ٢٠٠٩ | نزیك یاریگای گەورەی تۆپی پێ. |
| دروست کردنی سیاجێك و ناشتنی نەمام | ١٦ / ٤ / ٢٠١٠ | نزیك دەراش / لە یادی کیمیاباران. |
| دروست کردنی مەزارو کێلی شەهیدانی کیمیاباران کراو. | ١٦ / ٤ / ٢٠١٠ | نزیك گۆڕستانی بادینار / لە یادی کیمیاباران ناوی شەهیدانی کیمیابارانی لەسەر نوسراوە. |
| قیرتاوکردنی رێگای بالیسان +شێخ وەسان | ٢٢/ ٧ /٢٠١٠ | تەواو بو. |
| دروست کردنی هۆڵی پرسە. | ٢٠١٠ | ٢٠٠٩/٧/١٨ دەستی پیکرد. سەرەتای ٢٠١٠ تەواوبو. |
| فەرمانگەی ئاوی بالسان. | ٢٠١٠ | فەرمانبەرەکانی گرێبەست بون. |
| دانانی بەردی بناغەی ١٥٠ خانو بۆ شەهیدانی کیمیاباران. | ١٦ / ٤ / ٢٠١١ | نزیك گۆڕستانی بادینار / لە یادی کیمیاباران لە١٨/١٢ / ٢٠١٣ تەواوبولە ١٦ / ٤ / ٢٠١٦ دابەش کرا بەسەر کەس و کاری شەهیدان. |
| زێراب + تۆڕی ئاو + کۆنکرێتی شۆستە /بالیسانی نوێ | ٢٩ / ٧ / ٢٠١٢ | تەواو بو وەرگیرا. |
| بنکەی چاککردنەوەی کارەبای بالیسان. | ١٥ / ٥ / ٢٠١٣ | عوسمان ئەحمەد مێرگەسەری ل.بو. |
| دانانی بورجی ئینتەر نێت | ٢٠ / ٦ / ٢٠١٣ | نزیك گوندی دەراش. |
| دروست کردنی ڕێگای دوو سایدتاکو ناحیە | ٢٨ / ٩ / ٢٠١٣ | تەواو بو. |
| وێستگەی کارەبای بالیسان | ٢٠١٣ | ٢٠١٦ تەواو دەستی بەئیشکردن کرد. |
| مزگەوتی (شێخان) | ١٩/ ١٢ / ٢٠١٤ | سەرڕێگای گشتی پێش نوێژو وتار خوێن / مامۆستا مەلا ڕزگار موحەممەد یەکەم وتاری هەینی خوێندەوە/ دروست کردن / خێرخوازی. |
| مزگەوتی تەقوا (تقوی) | ١ / ٦ / ٢٠١٧ | دروست کردن / خێرخوازی. |
| مزگەوتی گەڕەکی (شەهیدان) | ٢٠١٧ | دروست کردن / خێرخوازی/تا ئێستا ناونەنرایەلەناو گەڕەکی شەهیدانە. |
| مزگەوتی نزیك گردی دێگە | ٢٠١٧ | دروست کردن / خێرخوازیناو نەنراوە. |
| کۆمسیۆنی بالأی هەڵبژاردن و ڕاپرسی هەرێمی کوردستان | ٢٠١٧ | بەروار یاسین بو بە لێپرسراو. |


مزگەوتی شێخان


باخچەی ساوایان - بالیسان



**وەرزش/ زۆر بواری جیاوازی هەیە و گرنگە، پێشکەوتن و چالاکی وگەشەپێدانی بەندە بە ڕۆڵ پێدان و هاوکاری لایەنی پەیوەندیدار.**

| | | |
|---|---|---|
| یاریگای گەورەی تۆپی پێی بالیسان | ٢٠٠٤ | بەشی باکوری بە کۆنکرێت دروست کراوە بۆ دانیشتن + سیاج کراوە/ شوێنەکەی خوار گۆڕستانی بادینارە. |
| دروست بونی یانەی وەرزشی | ٢٨ / ٨ / ٢٠٠٤ | بە نوسراوی ژمارە ٧٤٠ لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان صالح اکرم حەیدەری لێپرسراوی یانەبو. |
| یەکەم خولی کۆنگفۆ | ٢ / ٩ / ٢٠٠٤ | مهاجر شیخ وەسانی ڕاهینەر بو. |
| یەکەم خولی بالە | ٤ / ٩ / ٢٠٠٤ | حەوت تیپ بون. |
| یەکەم خولی تۆپی پێ | ١٣ / ٩ / ٢٠٠٤ | دە تیپ بەشداربون ئەوانیش (بالیسان ١ +بالیسان٢ + کانی بەرد +شێخ وەسان + خۆران +بێراوە + توتمە + دەراش + مێرگەسەر بۆ دروست بونی تیپی هەڵبژاردەی وەرزشی بالیسان بو. |
| یەکەم ڕاکردنی ٦٠٠٠ مەتری بۆ کوڕان | ٢٠ / ٤ / ٢٠٠٥ | سەفین یوسف یەکەم، ئاکۆ محمد دوەم، بەشدار سەمەد سێیەم. |
| یەکەم بەشداری تاقی کردنەوەی کیك بۆکسین لە دەربەندیخان سازکرابو. | ٣٠ / ٩ / ٢٠٠٥ | ٨ وەرزشوان بەشداربون (تەیب مستەفا+کردار حمدامین+میران حمدامین +گۆران خالد+جوتیار حمدامین +تحسین عبدالرحمن +بێستون ارکان +بەختیار محمدعلی پشتێنی زەردیان وەرگرت. |
| خولی دوەمی تۆپی پێ | ٢ / ٨ / ٢٠٠٦ | ١٢ تیپ بون تیپی تۆپی پێی شەهید (ملانجم) یەکەم بو تیپی تۆپی پێی برایەتی شەهید (عەریف حەسن) دوەم بو. |
| یەکەم ڕاکردن (مەراسون) بۆ کچان | ١٧ / ٤ / ٢٠٠٨ | ١٠ وەرزشوان بەشداربون (جیهان حمدامین حکیم) یەکەم بو. |
| یەکەم بەشداری ئامادەیی بالیسان لە چالاکیە وەرزشیەکانی ساڵانەی پەروەردەی کۆیە. | ١٧ / ٤ / ٢٠٠٨ | هەڵدانی قوڕسایی (زریان علی یحیی) پلەی دوەمی هێنا ڕاکردنی ٤٠٠ م مێران حمدامین پلەی دوەمی هێنا (سۆران محمد ابراهیم) لەیەك بازی پلەی سێیەمی هێنا. |
| یاریگای چیمەنی دەستکرد | ٢٠٠٩ | نزیك یاریگای تۆپی پێی بالیسان. |
| یاریگای چیمەنی دەستکردی شێخ وەسان | ٢٠١٠ | لە ناو گوندی شێخ وەسان. |
| یاریگای چیمەنی دەستکردی توتمە | ٢٠١١ | لەناو گوندی توتمەیە. |

چالاکی وەرزشی بەتایبەتی لە بواری تۆپی پێ بەردەوام بوە زۆربەی گەنجانی سنورەکە سودمەندن. لە دوای ئەم چالاکیانەوە تا ئیستاش بەردەوام لەلایەن زۆر لە دلسۆزو وەرزش دۆستان گرنگی بەوەرزش دەدرێت. کارو چالاکیان هەبوە بەتایبەتی تۆپی پێ و تۆپی سەرمێزو تۆپی بالە. هیوام وایە سەرجەم بوارەکان گرنگی تایبەتیان پێبدرێت لە داهاتو تا دەگاتە مەلەوانی و ئەسپ سواری و پاسکیل سواری و ماتۆڕ سکیل و ئۆتۆمبێل و شەترەنج و شاخەوانی و خۆ فرێدان بە پەڕەشوت لە بەرزایی و خلیسکانی سەر بەفرو وەرزشی شاخەوانی و هەمو یاریەکانی گۆڕەپان و مەیدان.





## ڕۆشنبیری

**کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەو بلاّوکراوە نیشانەی پێشکەوتنەو چەندایەتی و چۆنایەتی بەرهەمی هەلّێنجراو و ڕەنگدانەوەو تێگەیشتن و بیرکردنەوەی ڕوداوەکانی سەردەم و ژینگەی خاوەنەکانی و نوسەرەکانیەتی. لێرەدا ئەوەی لەم بوارەشدا نزیکە تۆمار کراوە.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| یەکەم سەتەلایت | ١٩٩٩ | د. اسماعیل هێنای(ئەنەلۆگ بو). | ناوبراو ل. بنکەی تەندروستی بالیسان بو.خزمەتی زۆری کرد. |
| لقی سەنتەری گەنجانی کوردستان | ١٩٩٩ | حسن حسین کانی بەردی | لێپرسراوی بو |
| یەکەم کۆمپیوتەر | ١٠ / ١٠ / ٢٠٠٢ | بۆ ئۆفیسی ناحیە. | |
| یەکەم مۆبایل | ٢٠٠٣ | هێڵەکەی ئاسیا سێڵ بو. | تۆڕی پەیوەندی زۆر کەم بو. |
| کتێبخانەی گشتی بالیسان | ٢٧ / ٤ / ٢٠٠٤ | نزیکەی ٢٥٠٠ پەرتوك و گۆڤاری تێدابو. | محمد جمال احمد بە بەڕێوەبەر دانرا. |
| بلاّوکراوەی ١٦ /٤ ساڵنامەبو | ١٦ / ٤ / ٢٠٠٤ | لەیادی کیمیابارانی ١٩٨٧ دەردەچو لە ژمارە ٦ بو بە گۆڤار و لە ژمارە ٨ بو بە گۆڤارێکی ژینگەیی. | تەنها پێنج ژمارەی لە شێوەی گۆڤار دەرچو. |
| یەکەم کۆڕی ڕۆشنبیری | ١٤/ ٤ / ٢٠٠٤ | بەناوی مێژوی ڕۆشنبیری خۆشناوەتی. | محمد جمال + سەردار عبدالرحمن کۆرەکەیان گێڕا. |
| یەکەم کۆڕی شیعری | ١٦ / ٤ / ٢٠٠٤ | م.بەرزان شەلال | ملازم ئەمیر بۆڵی. |
| یەکەم خولی کۆمپیوتەر | ٢٨ / ٨ / ٢٠٠٤ | ١٥ فێرخواز. لە سەر ٧ کۆمپیوتەر وانە دەوتراوە | فێرکار/ عەزیز حوسێن +سەیفولاّ بابەکر. |
| یەکەم ئینتەرنیت | ٧ / ١١ / ٢٠٠٤ | بە ناوی‌سەنتەری ئینتەرنێتی (شەهید مەلانەجم)ناو نرا. | |
| یانەی ڕۆشنبیری بالیسان | ٤ / ١٢ / ٢٠٠٤ | م.ئەحمەد مستەفا سەرۆکی یانە. | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کۆمەڵەی کوردستانێکی سەوز. | ٢٨ / ٢ / ٢٠٠٥ | سەرۆکی کۆمەڵە فەقێ شێخ وەسانی | |
| یەکەم کۆڕی فیکری. | ١٨ / ٤ / ٢٠٠٥ | بۆ مەلا سەلام حەیدەری بەسترا. | |
| یەکەم دوکان فۆتۆکۆپی و وێنەی(معاملات)وڕەنگاو ڕەنگ. | ١ / ٧ / ٢٠٠٦ | خاوەنەکەی م. حەمەدەمین لاسە باپیر. | |
| کتێبی (کیمیاباران لە خۆشناوەتی). | ١٦ / ٤ / ٢٠٠٦ تیراژ / ٥٠٠ دانە | صالح حەیدەری +محمد جمال + کەریم هەرتەلی دەستەی نوسەران. | لە ژێر ناوی هەوڵێك بۆ بە مێژوکردن. |
| یەکەم پێشانگەی وێنەی شەهیدان | ١ / ٦ / ٢٠٠٦ | لە یادی دامەزراندنی (ی. ن.ك) وێنەکان عمر شیخ وەسانی دابینی کردبون. | لە هۆڵی بۆنەکان نمایش کرا. |
| بڵاوکراوەی ئاوێر | ٢٥ / ٩ / ٢٠٠٦ | | (٣٣) ژمارەی لێ دەرچو |
| بڵاوکراوەی کۆڕەنگ. | ٢٦ / ٤ / ٢٠٠٧ | تەنها دوو ژمارەی دەرچو | م. ئەدیبە عوسمان دەری کرد. |
| کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیاباران و ئەنفالی خۆشناوەتی | ١٥ / ٦ / ٢٠٠٨ | فەرمانی وەزاری بۆ دەرچو. دەستەیەکی چوار کەسی بەڕێوەیان دەبرد. | هاوڕێ کاوە + فەقێ شێخ وەسانی + یاسین بالیسانی + عمر شێخ وەسانی |
| گۆڤاری (ڕاز) | ١٦ / ٤ / ٢٠٠٨ | لە یادی کیمیابارانی ١٦ / ٤ / ١٩٨٧ | م/ حەیدەر عەبدولاَ شێخ وەسانی خاوەنی بو. |
| گۆڤاری(خۆشناوەتی) | ٢٠٠٩ | وەرزی بو دوو ژمارەی دەرچو. | عەبدولاَ کانی بەردی خاوەنی ئیمتیاز بو. |
| دەستەی پاراستنی ژینگە | ٢٤ / ٦ / ٢٠١٨ | دەستەیەکی سەربەخۆیە | سەرپەرشت/ تاهیر جەلال |

**تێبینی / لەئیستادا هیچ جۆرە (بڵاوکراوە - ڕۆژنامە -هەفتەنامە- ساڵنامە - گۆڤار) دەرناچێ. بە هیوام لە ئایندەدا ئەمانەو بوارەکانی تری ڕاگەیاندنی گەشەسەندوی هەبێت.**

وتراوه زانین ڕۆناکیه نەزانین تاریکیە. کتێبخانەی گشتی بالیسان لە ٢٧ / ٤ / ٢٠٠٤ کرایەوە. سودی زۆری بۆ گەلێك چین و توێژ هەبوە، جێگەی دەست خۆشی هەمو ئەوانەیە کە هەوڵی زۆریان دا بۆ دروست بونی. بەتایبەتی کاك محمد جمال شایانی ڕێز لێنانە لەدوای دروست بونی زۆر ماندو بوە تیایدا. ئاماری کتێبخانەی گشتی بالیسان لە ١٨ /١ /٢٠١٠.

| ناوی بابەت | ژمارە | ناوی بابەت | ژمارە |
|---|---|---|---|
| بیرەوەری | ١٤١ | ڕۆمان | ٥٨٤ |
| هونەرو شانۆ | ١٩٤ | زانیاری گشتی | ٢٧٤ |
| کتێبی یاسایی | ٦٦ | مێژوو | ٩٦١ |
| رۆژنامەوانی | ٨٣ | ئاینی | ٤٣٨ |
| دیوانی شیعر | ٤٤٢ | تەندروستی | ٢٧٨ |
| ئەدەب و لێکۆڵینەوە | ٤٥٢ | ئابوری | ٨٣ |
| فەلسەفە (کتێب) | ١٧٩ | سیاسی | ٢٢٤ |
| خۆشنوس | ٤٩ | فەرهەنگ قاموس | ١٤٥ |
| کتێبی منداڵان | ٦٤٩ | کۆی گشتی کتێب | ٥٢٤٢ |
| گۆڤار بە گشتی | ١٣٩٩ | لەناویان دا ٩١گۆڤاری منداڵان هەیە | |

کۆی گشتی (٥٢٤٢)کتێب و (١٣٩٩) گۆڤا.

ئاماری کتێبخانەی گشتی بالیسان لە ٣/١٠ /٢٠١١

| | | |
|---|---|---|
| کتێبی کوردی | ٤٢٢٣ | |
| کتێبی بە زمانەکانی تر | ١٦٦٢ | زیاتربە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزین |
| گۆڤار | ١٥٦٠ | |
| کتێبی منداڵان | ٧٣٠ | |
| گۆڤاری منداڵان | ١٠١ | |
| کۆی گشتی کتێب و گۆڤار | ٨٢٧٦ | |

له ٨ / ٨ / ٢٠١٨ ئاماری کتێب و گۆڤارله کتێبخانەی گشتیی بالیسان بەم شێوەیە.

| | | |
|---|---|---|
| کتێبی کوردی | ٧٠٨٤ | |
| کتێبی عەرەبی | ٢٤٦٧ | |
| کتێبی زمانەکانی تر | ١٨٩٦ | |
| گۆڤاری کوردی | ١٧٤٧ | |
| گۆڤاری عەرەبی | ١٦٨ | |
| گۆڤاری زمانی تر | ٤٦ | |
| بەشی منداڵان | | |
| کتێبی کوردی منداڵان | ٩٠٩ | |
| کتێبی عەرەبی منداڵان | ١٦٥ | |
| کتێبی زمانی تر/ منداڵان | نیە | |
| گۆڤاری منداڵان | | |
| گۆڤاری کوردی منداڵان | ١٦٩ | |
| گۆڤاری عەرەبی منداڵان | نیە | |
| گۆڤاری زمانی تر منداڵان | نیە | |
| کۆی گشتی کتێب و گۆڤار. | ١٤٦٥١ | |

تێبینی / له ماوەی نێوان ئەم دوو داتایە کە حەوت ساڵە ٦٣٧٥ کتێب و گۆڤار زیادی کردوە. واتا ساڵێ نزیکەی هەزار کتێب و گۆڤار زیاد دەکات.

سەرنج / بەردەوام کتێبی بۆ زیاد دەبێت بەس جێگەی داخە کە بینایەی نیەو شوێنی زۆر تەنگ و نارێکە. بە هیوام لە دوارۆژێکی نزیك بینایەکی شایستەی بۆ بکرێت.

کتێبخانەی توتمە لە ٢٠١١ دامەزرا نزیکەی ١٥٠٠ کتێب و گۆڤاری تێدایە. بینایەی نیە.

کتێبخانەی شەهید سەبور لە شێخ وەسانان لە / ١٦ / ٤ / ٢٠١٢ دامەزرا تائێستا ساڵی ٢٠١٨ نزیکەی ٢٥٠٠ کتیب و ٣٠٠گۆڤاری تێدایە. بینایەی تایبەت بەخۆی نیە.

کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیاباران و

ئەنفالی خۆشناوەتی




خاوەنی ئیمتیاز:
سالح ئەکرەم حەیدەری
07301173114
سەرنوسەر:
کەریم عەبدوڵا هەرتەلی
٠٧٣٠١١٢٠٦٨٩

# ئاوێر
AWER

پەیامێکە رەش و سپی ئاوێر دەکات

لە ژمارەی داهاتوودا...

لەژمارەی داهاتووی ئاوێردا پاشکۆیەکی تایبەت بە بواری ژینگەو رۆژی ژینگەی کوردستان بخوێنەوە....

ژمارە (14) تشرینی دووەمی ٢٠٠٧ E_mail: awer_s@yahoo.com ژمارە سفری لە ئەیلولی ٢٠٠٦ دەرچووە بڵاوکراوەیەکی مانگانەی رۆشنبیری گشتیە

## بەبڕیاری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، بریار درا ٤/١٦ بکرێ بەرۆژی ژینگەی کوردستان.

یەکێک لە پاشماوەکانی کیمیابارانی ١٩٨٧/٤/١٦

بۆ یەکەم جار ژینگەی کوردستانیان لە رێگەی چەکی کیمیاوییەوە ژەهراوی‌کردوو، چەندین منداڵو ژنو پیاوی بێ گوناهیان لە ماڵەکانی خۆیان و ژینگەی خۆیان بە گازە ژەهراویەکانی خەردەلو سانید و گازە خنکێنەرەکانی تر خنکاند، ٤/١٦ بۆ بەرپەرچ دانەوەی هەموو ئەوانەیشە کە دەیانەوێ ژینگەی وڵاتەکەمان وێران بکەن، چونکە لەو رۆژەدا بۆ لەمەودوا لە هەموو ناوچەکانی کوردستان خەڵکی هەڵدەستی بە پاککردنەوەی شارەکانیان و ژینگەی وڵاتەکەیان... دەست خۆشی لە هەموو ئەوانە دەکەین کەوا بەدەنگ ئەوپرسەوە بوون.

## ستافی بڵاوکراوەی ئاوێر سەردانی وەزیری رۆشنبیری دەکات.

**بۆ یەکەم جار سەرژمێری دانیشتوانی سەرجەم سنوری ناحیە لە ژمارەی ماڵ - ژمارەی دانیشتوان - ژمارەی ڕەگەزی نێر - ژمارەی ڕەگەزی مێ - ژمارەی خوێندەوار - ژمارەی نەخوێندەوار- ژمارەی منداڵ یەك ڕۆژ تا شەش ساڵ. لە بەرواری ١٢ / ٥ / ٢٠٠٢ .**

| ناوی شوێن | ژ.ماڵ | ژ.دانیشتوان | ژ.نێر | ژ.مێ | ژ.خوێندەوار | ژ.نەخوێندەوار | ژ.مندال ١رۆژتا ٦سال |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **بالیسان** | ١٣٣ | ٧٢٩ | ٣٨٤ | ٣٤٥ | ٣١٢ | ٢٧٣ | ١٤٤ |
| **کانی بەرد** | ٤٣ | ٢٣٩ | ١٢٨ | ١١١ | ٧٣ | ١٠١ | ٦٥ |
| **شیخ وەسان** | ٧٦ | ٣٨٧ | ١٩٢ | ١٩٥ | ١٤٥ | ١٤٨ | ٩٤ |
| **خۆران** | ٤٢ | ١٧٤ | ٩١ | ٨٣ | ٦٤ | ٩٦ | ١٤ |
| **دەراش** | ٨ | ٣٩ | ٢٦ | ١٣ | ١٠ | ٢٦ | ٣ |
| **توتمە+باروکاوە** | ١٦٠ | ٩٠٤ | ٤٢٤ | ٤٨٠ | ٣٢٠ | ٣٥٢ | ٢٣٢ |
| **شیرەی سەرو** | ٤٠ | ٢٥٢ | ١١٧ | ١٣٥ | ٣٩ | ١٩٧ | ١٦ |
| **شیرەی خوارو** | ٤٢ | ٢١٣ | ١٠١ | ١١٢ | ٦٨ | ١٣٤ | ١١ |
| **خەتێ** | ١٠٥ | ٤٩١ | ٢٢٦ | ٢٦٥ | ١٥٣ | ١٩٢ | ١٠٦ |
| **بێرۆ** | ٣٢ | ١٩٥ | ١٠١ | ٩٤ | ٥٨ | ٩٤ | ٤٣ |
| **بێراوە** | ٦٥ | ٣١١ | ١٩٩ | ١١٢ | ١٠٣ | ١٤٠ | ٦٨ |
| **سپیلکە** | ٣٠ | ٥٣ | ٢٨ | ٢٥ | ٢٣ | ٢٠ | ١٠ |
| **کۆی گشتی** | ٧٧٦ | ٣٩٨٧ | ٢٠١٧ | ١٩٧٠ | ١٣٦٨ | ١٧٧٣ | ٨٠٦ |

**تێبینی / لەم داتایە ژمارەی خوێندەوار (١٣٦٨) کەسە بەڵام خاوەن بڕوانامە بەم جۆرە بون.**

١- **ناوەندی نزیکەی ١٥ دەرچو. ٢- ئامادەیی وێژەیی و زانستی / نزیکەی ١٠ دەرچو.**

٢- **دبلۆم / نزیکەی ٨دەرچو.٤ - بکالۆریۆس / نیە ٤- ماجستێر نیە ٥- دکتۆرا نیە.باقی توانای خویندنەوەو نوسینی هەیە.٥ -بەرواوردی رەگەزی دەرکەوێت ڕەگەزی نێر زیاترە بەرێژەی (٤٧)کەس.**

٣- **تا ساڵی ٢٠١٨ زیاترلە ١٠٠ خاوەن بڕوانامەی پەیمانگاو کۆلێژی لێیە.**

ئەم داتایە لە بەرواری ٢٧ / ١١ / ٢٠٠٨ کراوە.

| ناوی شوێن | ژ. ماڵ | ژ. دانیشتوان | ژ. ڕەگەزی نێر | ژ. ڕەگەزی مێ | |
|---|---|---|---|---|---|
| بالیسان | ٢٢١ | ١٠٣٦ | ٥١٤ | ٥٢٢ | |
| کانی بەرد | ٥٨ | ٣٠٤ | ١٤٣ | ١٦١ | |
| توتمە +باروکاوە | ١٦٠ | ٩٠٠ | ٥٠٤ | ٣٩٦ | |
| خەتێ | ١٠١ | ٤٢٩ | ١٩١ | ٢٣٨ | |
| بێڕۆ | ٣٥ | ١٩٩ | ٩٣ | ١٠٦ | |
| دەراش | ١٠ | ٥٠ | ٢٦ | ٢٤ | |
| خۆران | ٣٢ | ١٨٩ | ٩١ | ٩٨ | |
| بێراوە | ٦٣ | ٤٢٥ | ٢٠٤ | ٢٢١ | |
| شیرەی سەرو | ٣٠ | ١٨٢ | ٨٥ | ٩٧ | |
| شیرەی خوارو | ٣٣ | ١٧٥ | ٨١ | ٩٤ | |
| شێخ وەسان | ٥٨ | ٢٦٦ | ١٣١ | ١٣٥ | |
| سپیلکە | ٣ | ٢٠ | ٧ | ١٣ | |
| کۆی گشتی | ٨٠٤ | ٤١٧٥ | ٢٠٧٠ | ٢١٠٥ | |

تێبینی /

١- به بەراوورد ڕەگەزی مێ زیاترە بەڕێژەی ٣٥ کەس.

٢- لەداتای ٢٠٠٢ پێشتر رەگەزی نێر زیاتر بو بە ڕێژەی ٤٧ کەس.

٣- جێهێشتنی ولاَت دەکرێت یەك لە هۆکاری بەرزبونەوەی ڕێژەکەبێت.


نەخشەی بنەڕەتی بالیسان

ئەم داتایە لە ٢٠ / ٤ / ٢٠١٣ کراوە.

| ناوی شوێن | ژ. ماڵ | ژ. دانیشتوان | ژ. نێر | ژ. مێ | ژ. تەمەن سەرو ١٨ساڵ | ژمارەی تەمەن خوار١٨سال |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باليسان | ٢٧٥ | ١٣١٤ | ٦٧٣ | ٦٤١ | ٦٩٩ | ٦١٥ |
| گوندی کانی بەرد | ٣٩ | ١٨٨ | ١٠٢ | ٨٦ | ١٠٠ | ٨٨ |
| گورگان /ئاوەدانی لێ دروست بوە | ٩ | ٤٣ | ٢٦ | ١٧ | ٢٢ | ٢١ |
| گوندی شێخ وەسان | ٤٧ | ٢١٦ | ١١٤ | ١٠٢ | ١١٣ | ١٠٣ |
| گوندی بێراوە | ٦٢ | ٣٦٢ | ١٨٠ | ١٨٢ | ١٨١ | ١٨١ |
| گوندی شیرەی خوارو | ٤٢ | ١٩١ | ٩٤ | ٩٧ | ١٠٥ | ٨٦ |
| گوندی شیرەی سەرو | ٢٦ | ١٣٨ | ٦٨ | ٧٠ | ٧٥ | ٦٣ |
| گوندی خۆران | ٣٩ | ٢٢٣ | ١٠٣ | ١٢٠ | ١٠٧ | ١١٦ |
| کەندەسۆر/ ئاوەدانی لێ دروست بوە | ١٥ | ٨٢ | ٤٣ | ٣٩ | ٤٣ | ٣٩ |
| گوندی دەراش | ١٨ | ٧٧ | ٣٨ | ٣٩ | ٤٠ | ٣٧ |
| گوندی توتمە | ١٧٠ | ٨٣٢ | ٤٠٤ | ٤٢٨ | ٤٥٥ | ٣٧٧ |
| گوندی باروکاوە | ٣ | ١٢ | ٥ | ٧ | ٨ | ٤ |
| گوندی خەتێ | ١٠٥ | ٤١٧ | ١٩١ | ٢٢٦ | ٢٢٧ | ١٩٠ |
| گوندی بێڕۆ | ٢٧ | ١٤٥ | ٧٢ | ٧٣ | ٧٥ | ٧٠ |
| گوندی سپیلکە | ١ | ٤ | ٢ | ٢ | ٣ | ١ |
| کۆی گشتی | ٨٧٨ | ٤٢٤٧ | ٢١١٥ | ٢١٢٩ | ٢٢٥٣ | ١٩٩١ |

سەرنج / دانیشتوانی زیاتر پشت بە موچە وەرگرتن دەبەستن کەمتر خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین. جگە لە موچە خۆرانی پێشمەرگەو خانەنشینی سەربازی و مەدەنی، ژمارەی فەرمانبەرو موچە خۆرانی داو دەزگاکانی ناحیە لە ساڵی ٢٠١٠ پێنج سەدو چل و دو کەس موچە خۆر بون. بێگومان تا ساڵی ٢٠١٤ بەردەوام موچە خۆری زیاتر دەبو لە هەمو بوارەکان، نزیکە لەوەی هەمو خێزانێك موچەخۆرێك یان زیاتری هەیە. بەشەخۆراکی مانگانەش حکومەتی ناوەند دابەشی دەکات بە ژمارەی خێزان لەڕێگەی فۆڕمی خۆراك، بۆ هەرنەفەرێك(ئارد ٩ کیلۆ- برنج ٣ کیلۆ- شەکر ٢ کیلۆ-ڕۆن یەك لیتر).

**بەراوردی سەرژمێریەکانی ٢٢ / ٥ /٢٠٠٢ - ٢٧ / ١١ / ٢٠٠٨ - ٢٠ / ٤ / ٢٠١٣. لەکۆی گشتی ژمارەی ماڵ - ژمارەی دانیشتوان - ژمارەی ڕەگەزی نێر - ژمارەی ڕەگەزی مێ.**

| ساڵ | ١٢ / ٥ / ٢٠٠٢ | ٢٧ / ١١ / ٢٠٠٨ | ٢٠ /٤/ ٢٠١٣ |
|---|---|---|---|
| ژمارەی ماڵ | ٧٧٦ | ٨٠٤ | ٨٧٨ |
| ژمارەی دانیشتوان | ٣٩٨٧ | ٤١٧٥ | ٤٢٤٧ |
| ژمارەی رەگەزی نێر | ٢٠١٧ | ٢٠٧٠ | ٢١١٥ |
| ژمارەی رەگەزی مێ | ١٩٧٠ | ٢١٠٥ | ٢١٢٩ |

**ئەوەی جێی سەرنجە لە ٢٠٠٢ تاکو ٢٠١٣ ژمارەی ماڵ لە دەوری حەوسەد بۆ نزیکەی نۆسەد ماڵ بوە، نەگەیشتۆتە هەزار ماڵ. ئەمە وەنەبێت ڕێژەی دانیشتوان و هاوسەرگیریکردن زیاد نە بوبێت، بەڵکو بە هۆی جێهێشتنی دانیشتوانەکەیەتی کە گوندەکان چۆڵ دەکەن و بۆ ژیان دەچنە شارە گەورەکان. بۆیە دروست بونی ناحیە کاریگەری زۆری هەبو لە چۆڵ نەبونی سنورەکە.**

**کۆتا سەرژمێری سەرجەمی سنوری ناحیە لە ژمارەی سەرۆك خێزان و ژمارەی دانیشتوانی بەرواری**

**٢٥ / ١٢ / ٢٠١٨ کراوە.**

---

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ژمارەی خێزان | ١٠٨٧ ماڵ | | | |
| ژمارەی دانیشتوان | ٤٨١٦ | | | |

**تێبینی/ دوای بیست ساڵ لە دروست بونی بو بە (١٠٨٧) ماڵ.**

**لەو ١٠٨٧ ماڵە زیاترلە ١١٥ خێزان کەم دەرامەتن و لە هێڵی هەژاریدان. ڕێژەی هەرەزۆر چینی ناوەندەو دەوڵەمەندی کەمە.**

**باخچەی ساوایانی بالیسان.**

| بەرواری کردنەوە (دامەزراندن) | ١٦ / ١٠ / ٢٠١١ | م. بوشرا فەتحولاَ ئەحمەد بەڕێوەبەر |
|---|---|---|
| ساڵی خوێندنی ٢٠١١=٢٠١٢ | ٦٤ منداڵ | |
| ساڵی خوێندنی ٢٠١٢ - ٢٠١٣ | ٤٣ منداڵ | |
| ساڵی خوێندنی ٢٠١٨- ٢٠١٩ | ٤٨ منداڵ | |

**تێبینی / لە ساڵی دامەزراندنی تاکو ٢٠١٨ ٢٣٨ منداڵ لە کچان و کوڕان فێری پەروەردەو ڕاهێنان کراون بۆ خوێندنگاکان. باخچەی ساوایانی گوڵەباخ / لە توتمە بەرواری ٢٨ / ١٠ / ٢٠١٤ کراوەو مامۆستا کەیغان حەسۆ نەسرەدین کرایە بەڕێوەبەر. لە ساڵی دامەزراندنی تاکو ٢٠١٨ (١٥٦) منداڵ پەروەردە کراون بۆ خوێندنگاکان.**

داتاو ئاماری خوێندنگاکان - ژمارەی مامۆستایان- ژمارەی خوێندکاران- ژمارەی خوێندکارانی کچ + ژمارەی خوێندکارانی کوڕ. بەرواری ٦ / ١٠ / ٢٠١٠ کراوە. زۆر سوپاسی بەڕێوەبەرەکان دەکەم هاوکاریان کردوم.

| ناوی خوێندنگە | ژ. مامۆستایان | ژ.خوێندکاران | ژ.خ. کچ | ژ.خ. کوڕ | بینایەی خوێندنی هەیە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامادەیی بالیسانی تێکەلأو زانستی +ئەدەبی. | ١١ | ٢١٢ | ٦٣ | ١٤٩ | ٨ پۆلە | |
| خ. ب.شەهید عبدالخالق /بالیسانی تێکەلأو. | ٢٥ | ٣٤٨ | ١٣٨ | ٢١٠ | ٨ پۆلە | |
| خوێندنگەی.ب. بالیسانی تیکەلاو. | ٩ | ٧٥ | ٣٧ | ٣٨ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. شیرەی سەرو. | ٦ | ٣٥ | ١٥ | ٢٠ | ٤ پۆلە | |
| خ.ب. شیرەی خوارو. | ٢ | ٣٥ | ١٨ | ١٧ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب.خۆران. | ٤ | ٧٧ | ٣٩ | ٣٨ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. بێراوە. | ٥ | ٦٨ | ٣٣ | ٣٥ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. شێخ وەسان. | ٤ | ٥٤ | ١٩ | ٣٥ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. دەراش. | ٣ | ١٦ | ٨ | ٨ | ٣ پۆلە | |
| خ.ب. توتمە. | ٨ | ١٦٠ | ٧٨ | ٨٢ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. باروکاوە. | ١٢ | ١٦٠ | ٦٨ | ٩٢ | ٩ پۆلە | |
| خ.ب. خەتێ. | ٩ | ٩٣ | ٥٢ | ٤١ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. کانی بەرد. | ٧ | ٥٩ | ٢٧ | ٣٨ | ٦ پۆلە | |
| خ.ب. بێڕۆ. | ٥ | ٢٥ | ١٤ | ١١ | ٥ پۆلە | |
| کۆی گشتی. | ١١٠ | ١٤١٧ | ٦٠٩ | ٨٠٨ | ٨٥ | |

تێبینی / ١- هەمو خوێندنگەکان تێکەلأون لە کچان و کوڕان.

٢- جیاوازی نێوان خوێندکارانی کوڕو کچ ١٩٩ کوڕ ڕێژەیان زیاترە لە ڕێژەی کچان.

٣- مامۆستای خۆجێیی بەژمارە کەم بون چەندین مامۆستا لە دورەوە هاتون و خزمەتیان کردوە تائێستاش بەردەوامن. شایانی ڕێزو پێزانینی زۆرن خزمەتیان بەرز دەنرخێنین. بەهەمان شێوە پزیشکان و کارمەندانی تەندروستیش.

**ئامارو داتای خوێندنگەی ئامادەیی و بنەڕەتیەکانی سنوری ناحیەی بالیسان لە ژمارەی مامۆستایان- وانەبێژان- ژمارەی خوێندکاران- ژمارەی خوێندکارانی کوڕ - ژمارەی خوێندکارانی کچ - ژمارەی هۆبەی خوێندن - ژمارەی کارگوزار -ژمارەی نوسەران (کاتب)- ژمارەی پاسەوان. لە بەرواری ٤ / ٤ / ٢٠١٣. بەسوپاسەوە بەڕێوەبەرەکان هاوکاریان کردوم.**

| ناوی خویندنگاکان. | ژ.مامۆستایان | ژ. وانەبێژ | ژ. خوێندکاران | ژ.خ. کچ | ژ.خ. کوڕ | ژ. هۆبە | ژ.نوسەر | ژ.کارگوزاران | ژ.پاسەوانان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامادەییبالیسان/زانستی+ وێژەیی | ١٥ | ١ | ٢٤٥ | ١٠٩ | ١٣٦ | ٨ | نیەتی | ٢ | نیەتی |
| خ.ب. شەهید عبدالخالق بالیسانی تێکەڵاو | ٢٠ | ٢ | ٣٨٣ | ١٦٨ | ٢١٥ | ١١ | ١ | ٢ | نیەتی |
| خ.ب. بالیسانی تێکەلاْو | ٥ | ١ | ٤٤ | ٢٣ | ٢١ | ٦ | نیەتی | ١ | نیەتی |
| خ.ب. شیرەی سەرو | نیەتی | ٥ | ٣٣ | ١٣ | ٢٠ | ٥ | نیەتی | ١ | نیەتی |
| خ. ب. شیرەی خوارو | ٢ | ١ | ٣٨ | ١٩ | ١٩ | ٦ | نیەتی | ١ | نیەتی |
| خ. ب. بێراوەی تێکەلاو | ٣ | ٣ | ٧٨ | ٣٩ | ٣٩ | ٦ | نیەتی | ٣ | ١ |
| خ. ب. خۆرانی تپکەڵاو | ٤ | ٢ | ٥٩ | ٣٧ | ٢٢ | ٦ | نیەتی | ١ | نیەتی |
| خ. ب. کانی بەرد | ٤ | ١ | ٥٢ | ٢٢ | ٣٠ | ٦ | نیەتی | ٣ | ١ |
| خ. ب. دەراش | ٤ | — | ١٩ | ١٠ | ٩ | ٥ | نیەتی | ٢ | نیەتی |
| خ. ب. شیخ وەسان | ٢ | ٢ | ٥٠ | ٢٨ | ٢٢ | ٦ | نیەتی | ٢ | ٢ |
| خ. ب. توتمە | ٦ | ٣ | ٩٧ | ٤٦ | ٥١ | ٦ | نیەتی | ١ | ١ |
| باروکاوە | ١٣ | ١ | ١٧٨ | ٨٠ | ٩٨ | ١١ | نیەتی | ١ | نیەتی |
| خ. ب. بێڕۆ | ٢ | ٢ | ٢١ | ١٣ | ٨ | ٥ | ١ | ٣ | ٢ |
| خ. ب. خەتێ | ٦ | ٣ | ١٠٢ | ٤٩ | ٥٣ | ٧ | ١ | ١ | ٢ |
| کۆی گشتی | ٨٦ | ٢٧ | ١٣٩٩ | ٦٥٦ | ٧٤٣ | ٩٤ | ٣ | ٢٤ | ٩ |

**تێبینی /**

**١- هەمو خوێندنگەکان تێکەلاْون لە کچان و کوڕان.**

**٢- جیاوازی نێوان خوێندکارانی کچان وکوڕان تەنها (٨٧) کوڕژمارەیان زیاترە.**

